# « حەسەن زیرەك » ی
# بلیمەت




شێرزاد عبدالرحمن

چاپخانەی «الحوادث»
بغداد ١٩٧٨

ئـەو کاتەی ـ حسن زیرەك ـی بلیمەت ، باروبارگەی خۆی تێكنـاو ، بەبێماڵ ئـاوایی جێیهێشتین ، هەزارەها ئاوازی پڕ غوربەتـی لەنێـو دڵو دیدەی ئێمـەدا بەجێهێشتو ئـەو ئاوازە رەسـەنانە هەتـا هـەتایێ ناسـنامەی مانەوەی ئـەو گۆرانیبێژە بێنازەو گـۆرانی راستەقینەی کوردییە ٠

ئەوکاتـەی ـ حسن زیـرەك ـی بلیمـەت لەگیانەلادابو ، هێشتا دەیەها ئاوازی غەریبترو سەدەهـا خۆزگەی تێنـووتر لە دەروونی ئـەو رێبوارە داهێنەرەدابو کە ئـاوازو دەنـگە پـڕ ژانـەکەی ناسنامـەی بـوونی میللەتێـك و سەرهەڵدانی ژانێکی لەخۆی گەورەتر بو ٠

بـەلاّم لە چرپەیـەکدا ، مەرگ ، چرنۆکی لەخۆزگەو تاسەکانی گرتو سەرایای ئاواتەکانی ڕامالی ، وەهەر لەو چرپەیەدا دلی گەورەی ئـەم بلیمەتە لە لیدان کەوت ! ٠

## ئەو مرۆڤە ساکارە چی گۆڕی ؟ ٠

لە ماوەی ژیـانی پڕ ئەشکەنجەی خـۆیدا ، توانی بێشکەیەك بۆ گۆرانی کوردی دروسـت بکات ٠٠ وەئـەو بێشـکەی « حسن زیرەك »ی هونەرمەند بـۆ گۆرانی کوردی دروستی کرد ، دلی ئێمە تیّدا گاگۆلەی کرد ، وە جۆلانەیەك بو ژانی ئاوازی کوردی تێدا لەدایك بو ٠

دەنگی شیرینی ئەو هونەرمەندە شتێکی ئاسایی نەبـو ، هەروەکو ئـاوازە ڕەنگاوڕەنگەکانیشی سەراپای شتێکی ئاسایی نەبوون بۆیە ، هـەتا هەتایە ئەو زرگ و ئەوتەلانو ئەو شاخ وئەوداخ لە ووتنەوەی قـەت وقـەت تێر نـابنو دەماودەم دەیلێنەوە ٠

بۆیە ، دور نیە ، ئەگەر ئـەو گۆرانیبـێژە کوردە ، نـاوی لیّ بـنریّ ئۆپرایـەکی کەورەی کـوردی ، یادرامایەك ، یا بلیمەتێك ، یاخـود « ڕێکەوت »ێکە زلی سەر ئەم خاکە ٠

کتێبخانەی گۆرانی کوردی دەولەمەندکرد ، وە ئەم کتێبخانەیە خۆی لە خۆیدا، ناسنامەیە بۆ نەمری ئەو دەنگە ژانگرتووە و بزرنەبونی شوێن پیّی لە مەیدانی تەکانـدانی گۆرانی کوردی و سەرهەڵدانی ئاواتەکانی ٠

لەبەرئەوە، دورنیە، ئەگەر دان بەوەد بنێین، کە ، ئـەو ئەسـتێرە گەشـەی کە لە ئاسـمانی هونەری کوردیدا کشا، جارێکەتر ئەستێرەیەکی وەها لەوگەشتر هەڵنەهێتەوە ، یان ، نموونەی ئەو بلیمەتە وێنەی نەبێتەوە ٠

« حسن زیرەك » ئـەو پیـاوە بەساڵاچۆەی کە ، توانی ، بە داهێنانەکانی خۆی ، لە پـاڵ ئەوەی کە مرۆڤێکی نەخوێندەوار بوو ، شەپۆلی گۆرانی کوردی بگۆڕێت ٠ وە لە ژمارەی هەزار

گۆرانی رەنگاوڕەنگ، ئەو هونەرمەندە لە ڕاستی دڵسۆزی خۆی بەرامبەر بە هونەری کوردی لای نەداو ئێستاش لە هەرکوێ ئاوازی شیرینی « حسن زیرەك » لە دایك بێ ، لەوێوە ، گۆرانی رەسەن ، سالآنێکی دور ، درێژی زیاتر لە نیو سەدە ، گۆرانی بۆ خۆشەویستی و مرۆڤ و خاك ووت ٠

کە مرۆڤ گوێی لە دەنگە ڕەسەنەکەی ئەبێ ، ژیان ، بە هەمو ئازارەکانیە وە ، بە سەوزی خۆی ئەنوێنێ ؛ بۆیە ، حسن زیرەك ، رەمزی خۆشەویستی یەکی گەورەی ژیانە و نیشانە ناسنامەی بوونمانە ٠ بۆیە ، حسن زیرەك ، بە « لوتکە »ی گۆرانی کوردی ناوزەد ئەکرێ ٠٠وە هەتاسەر بە لوتکەی گۆرانی کوردی ئەمێنتەوە ٠

دڵ نەبو لە گەڵ چرپەو هەناسەی ئەو بڵیمەتەدا نەخورپێ ، دیدە نەبو لە گەڵ « ناڵە شکێنێ »فرمێسك نەرێژێ ، دەروون نەبو لە

گەل « چارۆگە » و « کیژان » و « جێم دێڵی »
نەسووتێ و نەبێ بەخۆڵەمێش ٠

بەڵام هەتا مرد بە تاسەی ئەوەبو ، ڕۆژێ لە ڕۆژان ، تاقە ژەمێك تێر نان بخوات ٠ ئەی کەمرد ؟ ! ٠

کاسیتی گلەییەکانی بوون بە باوەشێ فرمێسك ٠٠

بوون بە خەزان لە گەردنی « سیلەی قەبران » دا بە گوڕ هاتنە خوار ٠

● ـ حسن زیرەك ـ لە نێو ئێمەدا نەماوە ، بەڵام هەمودەم ، لەخەیاڵ زیندەگی دەگەڵدا دەکەین » دڵ و دیدەمان بە فرمێسكو زەردەخەی گۆرانییە بە سۆزەکانی تێرئەکەین ٠٠

ڕەنگكو ڕوخساری هونەرمەندیوا ، هێندە بەئاسانی کوێر نابێتەوە ٠

وه ــ حسن زيرەك ــ لەجياتى ئەوەى مەداليای بەسنگەوە بكرێ ، خۆی لەخۆیدا مەدالیایە ٠ وە مەدالیاکەی تەنها مەدالیای هونەرمەندێکی ئاسایی نیە ، بەڵکو ، مەدالیای هونەری میللەتێکە ٠

« حسن زيرەك » كۆچەکەی ئاسایی نەبو ، وە مەزاری ئەو گۆرانی بێژە بێ نازە بۆنی غوربەتیی لێ دێ ، بۆنی ئادەمیزادێك کە تادوا هەناسە ژیانی پڕبو لە بەخشش ٠

بویە ، ژیانی پاش مردنی بۆ هونەرمەندیوا ، یان ، بۆ دڵی وەها مەزن قەتوقەت باجی لەسەر نیە ٠

**شێرزاد عبدالرحمن**

١٩٧٨ــ٧ــ٢٦

کتێبخانەی گشتیی هەولێر

ســاكار ..

ئـارەزوو ..

میدیای زندی ..

له « حسن زیرەك » ئەدوێن ..

## ئارەزووی حسن زیرەك :

ئەمن مەحببەتی زیرەك ، یا بە جۆرێکی دیکە «ئـــارەزوو »ی زیـــرەك ، کچی گەورەی حسن زیرەك ، خانندەگی کوردم ، ئارەزووی سـبـاغو سلامەتی بۆ هەموتان دەکەم ·

ئومێـــدەوارم کە شەووڕوژتـــان بەخـــۆشی بەسەربەرن · ئەوڕۆ ، ساڵڕوژی لەدایکبونی بابمە ، چەنــد ســاڵ پێش ئــەو ڕۆژە بــابم لەدەست چووو کۆچیکرد ، وە ئێمەی بەتەنهـــا بەجێهێشـــت · ئەمما ، ئێـــوەی خوشکوبـــرا کوردەکان ، وە ئەو کەسانەی کە من دەیانناسم ، یان ئەمن دەنـــاسن ، ئەوەنـــدە بەمن مەحببـــەت

دەکەن کەئەسڵەن فیکری ئەوە ناکەم کە بابـم لەدەستچووە ٠

یەکێك لەبەر ئەو خاترە ، یەکێکیش لەبەر ئـەو خاتـرەی هونەرێـك کە بـابم لەخــۆی بەجێهێشن ، هونەرێـك کە بابـم بەتـەواوی وجـودی ، بەتـەواوی زینــدەکی بۆخــۆی بەجێهێشــت ، بایەخــە بــۆمن وهیچوەختێك نەمردووە ٠

ئەو پیاوێــکە گەورەبو ، پیاوێكبــو ، کە هونەر لە خوێنیبو ، وە پیاویكبو کە بەبێئەوەی سەوادیهەبێ ، یا مەعلوماتێکی هەبێ ، تـوانی خۆی بەو جێگایە بگەیەنی کە دەیەوێ ، بۆ ئــەو جێگایەش کە پێی خۆشبو ، رۆیشتن ٠

ئەمن بەتەمەن منداڵبوم ، زۆر چکۆڵەبووم ، وەختێ کە باوکم مرد ٠ یانزە ساڵبووم ٠ لە زەمانی منداڵی شتێکم بەبیر نایێ ؛ هەمیشە لــە گوێچگەدە ٠٠ هەمیشە لە دڵمە ٠

ئەمما ئێستاش ، کە بابم مرد ، لە دڵمە کە دەیگوت : ـ

« سوورە گوڵێی سەحرای چینێ ، دانیشە بتبێنم ، جا دەرچێ گیانی شیرینم »(١) ٠

ئەمن هەمیشە ئەوە لە گوێچکەی منە٠ وە ئەو هیوایەم هەیە کە بتوانم کچێکی چابم بۆ بابم ، بتوانم لایەقەتی ئەوەم هەبێ سوورە گوڵێی سەحرای چین بم ٠

× × ×

---

(١) هونەرمەند ـ حسن زیرەك ـ گۆرانی یەکی بەسۆزی هەیە بەناوی « ئاردزوو » ؛ وە لەپارچەی یەکەمدا دەڵێ :

« خونچەی دڵەکەم ئـاردزوو
بۆم ببە بەگوڵ زوو بەزوو »٠

ئەگەرچی ئەو گۆرانی یە شتێکی سادەبووە بەلای حسن زیرەکەوەو تەنها بۆدڵدانەوەو لاواندنەوەی «ئاردزوو» بووە ؛ بەڵام ئاوازێکی سەرکەوتووی لێ دەرچووە .

من ئەوە شانزە ساڵمە لە کن دایکمزیندەگی دەکەم • دایکم سەرپەرشتی ئێمەی گرتۆتە ئەستۆ ، وە خودای پەروەریش ئێمە گەورەدەکا •

ئەمن لە ساڵی دووەمی نەزەری دەرسێ دەخوێنم هەڵبەتە ئەو ئێوارانەی کە بێکارم لە بەرنامە بەشداریئەکەم •

رادیۆم خۆش دەوێ ، چونکە بۆنی بابمی لێدێ چۆن ، هەر وەك پێ لە ڕادیۆ دەنێم ، ئیحساس دەکەم ئەوە چومە لای بابم ، چۆن بابم لە رادیۆ دەستیپێکرد •

دایکم زۆر زەحمەت بۆ ئێمە دەکێشێ ، وەئەو کارەی کە دەیکا ، ئەسڵەن فکر ناکەین کە بابمان لە دەستی چووە • زۆر بەئێمە میهرەبانی دەکا • خسوسەن هەم کارەکان زۆر لە گەڵ من مەحببەت دەکەن ، وە من لێرەدا زۆر لێیان تەشەکور دەکەم • هەڵبەتە ، خاتیرەیەکی زۆر

له بابمه‌وه بۆ من نه‌ماوه‌ته‌وه ، چونکه من هێشتا مندال بوم که ئه‌و مرد ، ئه‌مما ، جوانترین خاتیره‌یه‌ك که به ته‌واوی عومرم له‌بیرم ناچێ ئه‌وه‌یه ، ئه‌و زه‌مانه‌ی که بابم نه‌خۆش بو ، له‌مێژبو ئه‌من هێشتا نه‌م دیتبوو ، هاتم سه‌ری لێبده‌م بزانم چۆنه .. وه‌ختێ منی‌دی، چاوه‌کانی پڕبو له خوێن و گوتی خودایه ئه‌وه‌نده‌م به‌سه به‌و ئاره‌زووه مت گه‌یاند که‌خۆم ببینم ، که ئاره‌زوو پێم بلێ « بابه » . وه ده‌یگوت : « ئێستا که گیان له من بستێنێ هیچم پێ ناگات . چۆن گه‌وره‌ترین گیانی دنیات به منْدا ، ئاره‌زووم هه‌بومندالم هه‌بێ ، وه مندالم گه‌وره‌بێ » .

وه ئه‌وه‌ی ووتم زۆر خاتیره‌یه‌کی گه‌وره‌یه بۆ من ، هیچ وه‌خت بیرم ناچێته‌وه ، وه هه‌میشه له خاتیره‌مدا ده‌مینێ هه‌لبه‌ته بابم ، وه‌ك هه‌ر بابێکی دیکه ، نه‌سیحه‌تی زۆری به من کرد ، هه‌رچه‌نده که فورسه‌تێکی زۆر که‌می هه‌بو ،

چونکه پاش دو مانگ لەو نەسیحەتانە لە دنیایێ ڕۆیشت • وە گەورەترین نەسیحەتی بە من ئەوە بو کە کچێکی چاك بم ، کچێك کە بایەخی ئیفتخاری بابم بم ، وە بایەخی ئیفتخاری دایکم ، وە خسوسەن کوردەکان بم • کچێك کە کوردەکان نێوم دێنن ، ئیحساس بە شادی بکەن و وە بیرمەرحەمەتی باوکم بکەون • بتوانم دەرس بخوێنم •• چاك دەرس بخوێنم • لە منی ویست هەتا ئاخیری عومرم دەرس بخوێنم •

گوتی : ئەتۆ ئەگەر هیچ کەست نەبێ ، زۆر چاکتر ئەوەیە کە عیلمت هەبێ • ئەبێ عیلمت زۆرتر بێ• زۆرتر دەرس بخوێنی• ئێستا دایکت کارئەکا ، واتۆی لە ژێر باڵی خۆی گرتووە • ئەتۆ لەو فەرسەتە ئیستفادە بکەو کچێکی چاك بە • چۆنکە زۆر دایك هەن لەو دونیایەدا منداڵەکانیان لە کۆڵدەکەن ، بەڵام دایکی تۆ ، ئەتۆی لەژێر باڵی خۆی داگرتووە • بۆ تۆ زەحمەت دەکێشێ •

تۆش جوابی زەحمەتەکانی بەچاکی بدەوە ٠

ئەوانە گەورەترین نەسیحەتێك بـوون کە بابم بـە منی کرد ، وە من شــفایێ دەکەم ئـەو نەسیحەتە بەجێ ببێنم

× × ×

## ساکار حسن زیرەك :

ئەمن ، ساکار کچی چکۆڵەی حسن زیرەکم ، لەلای دایکم زیندەگی دەکەم . ئەمن ئەسڵەن شك نابەم کە بابم مردووە ، چونکە هەرکوێ دەچم ، دەنگی دێ ، وە هەمو کەس بەمن مەحەببەت دەکەن .

وە خاتیرەیەکی جوانم هەیە لە بابم ئەوەیە کە ، وەختێ ئەمن زۆر چکۆڵەبوم ، لە کن ئەوبووم ، وەختێ دەچومە دەرێ ، بابم دەیگوت ساکار بێننە ژوورێ ، چونکە وەختێ دەنگی ماشین دێ ، دڵی من دەترسێ .

ئەمن قەت فکر ناکەم کە بابم مردووە ، چونکە دەنگی وەکو ئەوەیە کە ڕەنگی هەبێ .

× × ×

## میدیای زیندی لە حسن زیرەك ئەدویّ

حسن زیرەك ، پێش پێنج سالْ ، لەوەهـا ڕوژێك ئێمەی بەجیّهێشت ، وە ڕویشت بۆ ئەو جێگایەی کە هەمومان تیّ‌ی‌دەچین .

هەڵبەتە وەختیّ ئەو ڕۆیشت، مەسئولیەتێکی زۆریشی بـۆ من بەجیّهێشت ، ئەویـش بـــە خێوکردن و ڕاگرتنی دوو کچی بیّسەرفیرازە لە شارێکی غەریب .

هیوادارم خودا قووەتم بدات بتوانم ئـــەو مندالاّنە بەو جۆرەی کە ئەو ئەیویست ، وە کە ئەو ئاواتی بو ، چونکە ئەو وەختەی کە ئەو مابو ،

بە منی دەگوت منداڵەکانی من بۆ کەس بەجێمەیەڵە · بۆ خۆت رای گرە ، وە ئەو جۆرەی کە من ئارەزووومە بە عەمەلیان بێنە ·

ئەلحەمدوللا منداڵەکانیش ، تا ئەو ڕادەیەی کە پێ گەیشتون ، بە ووتەی هەموان منداڵی چاکن · وە من هیوادارم کە زۆر زۆر چاکتر بن ·

باش لە بیرمە ، لە ساڵی ۳۷ ، بیست ساڵ زیاتر لە مەو پێش ، وەختێ کە من کچ بوم لە ماڵێ ، مەرحومی حەسەن زیرەك هات بۆ ماڵی بابم · من خۆم کورد بوم ، بە یەکەوە ، لە گەڵ حەسەن زیرەك چوین بۆ ئێستگە ، بەڵام نەم دەزانی کە من بۆیە دەبا بۆ ئێستگەکە بمخوازێ ·

هەرچەندە خودا لێ خۆش بو مرد ، وەو لە بەینی ئێمەدا نەماوە ، دیسان لێی سوپاس گوزارم ، چونکە ئەوە بووە وەسیلەیەك من خزمەتی کوردی پێ بکەم ، وە هەروەها ژیانی

منداڵەکانمی پێ بسوڕێنم ٠

من ئاواتم ئەوەیە خودا بەمن یارمەتی بدا ، تا باشتر خزمەت بکەم ٠

وە من هیچ وەخت فکر ناکەم کە ئەو مردووە ٠ گۆرانییە خۆشەکانی ، وە بەزمە خۆشەکانی لە هەمو جێیەك داهەیە ٠ وە باوەڕ ناکەم کە هیچ کوردێك ، دڵی بە دەنگی حەسەن نەکرێتەوە ٠

هەر کوردێك ، لە هەر شوێنێ ، چەند ئەوەندەی ــ حسن ــ یان خۆش دەوێ ، سەد ئەوەندە بە منداڵەکانی ، وە بەمن ، مەحەبەت دەکەن ٠

وە ئەوان بۆ من هەمو کەسن ٠ وە لە خودای گەورە داوادەکەم ، کە خودا حەسەن ببەخشێ ، منیش یارمەتی بدا منداڵەکانی بە چاکە بەخێو بکەم ٠

## چەند سەرنجێکی پێویست ••

× کاتێ سەرنــج دەدرێتــە گۆرانی یــەکانی هونەرمەند ـ حسن زیرەك ـ راستــەوخۆ ئــەوە یەکالائەبێتەوە ، کە ، زۆربەی بەرهەمەکانی لــە ناخی ئاوازی رەسەنی کوردەواری هەڵقولاون و ، تاقە گۆرانی یەك لەو مۆرکە رەسەنە لای نەداوە • وە لەبەرئــــەوەی ـ حســن زیرەك ـ بــە هونەرمەندێکی میللی نــاسراو ، وە گۆرانــی یەکانی لەم سنوورەوە تێناپەڕن •• زۆر جــار بەرهەمــەکانی بەنــــاوی ـ فۆلکلــۆر ـ ەوە ناوئەبرێ • وە تواناو بــەهرەی داهێنــی ئــەم هونەرمەندە شارراوەتەوە • واتــە ، زۆربــەی ئەوتیپــانەی کــە گۆرانی یــــەکانی ئـــەو

هونەرمەندەیان تۆماركردووە ، لەتایتلو كەتەلۆكی گۆرانی‌یەكاندا بەناوی ــ فۆلكلۆر ــ تۆماریان كردووە ؛ بەبێ ئەوەی سەرنج بدەنە ئەوەی ــ حەسەن زیرەك ــ شەونخونی و ئازارو هیلاكی بەدانانی ئەم ئاوازە زیندووانە چێشتووە ، وە دەستێكی هونەری و دەسەلاتێكی پڕ لە داهێنانی هەبووە ٠

× وە یاخود زۆر هونەرمەندی تر ، كاتێ لاسایی ئەو هونەرمەندە ئەكەنەوە ، دەسكاری لە «دەق»ی گۆرانی‌یەكانی ئەكەن ٠٠ لێرەدا تواناو هیلاكی« حسن زیرەك » لە دانانی شیعری گۆرانی‌یەكانیشدا وون ئەبێ ٠ تا وای لێدێ ، كە ، ئەو گۆرانی‌یانەی هونەرمەندی ناوبراو تۆماری كردون ، هیچ پەیوەندی بە ئەوەوە نەمێنێ و ئەو هەمو ئازارو هیلاكی‌یەی بكرێ بە گەرووی ئاگرا ٠

بۆیە ، واپێویستە كە لایەنە هونەری‌یەكان تێبینی ئەودیاردەیە بكەن ؛ وە هەوڵ‌بدرێ كە

ئەو بەرهەمانە بە ناوی خۆیەوە تۆماربکرێن ، نەك فۆلكلۆر .

× وا چەند ساڵێکە ئەو هونەرمەندە مەزنە ، یا ئەو ئەستێرە گەشە کشاوە ، بەلاّم هیچ ساڵێك ، نە بە بۆنەی لە دایك بونی ، وە نە بە بۆنەی کۆچی دوایی ، لە لایەن دەزگا هونەری یەکان هیچ شتێکی وای بۆ نەکراوە کە شایانی ئەو هونەرمەندە بێ .

بۆیە ، لایەنە بەرپرسیارەکان لە دەزگاکانی هونەری ، پێویستی سەرشانیانە ئاورێکی دڵسۆزانە تر لەم هونەرمەندەو بەرهەمەلانی بدەنەوە .

---


٥٠٠٠ دانە لەم کتێبە لەچاپ دراوە

لێبونەوە لەچاپ ١٩٧٨/٨/١٤

**لە کتێبخانەی نیشتیمانی - بەغدا**

**ژمارە ٩٧٠ی ساڵی ١٩٧٨ی دراوەتێ**